# باوکم بۆی گێڕامەوە

## لە حەدیسی جوبریل



ئامادەکردنی
خدر حمد خەتی

٢٠١٥

وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا

# باوكم بۆی گێڕامەوە

## لەحەدیسی جبریل

ئامادەکردنی

خدر حمد خەتی

باوكم بۆی گێڕامەوە : لەحەدیسی جبریل
ئامادەكردنی: خدر حمد خەتی
تیراژ : ( ٢٢٠٠ ) دانە
چوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلات/هەولێر
لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی سپاردنی ( ٣١٣ ) ی ساڵی ٢٠١٥ی پێ دراوە.

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

**بەڕێزان بۆچی بیرم لەوە کردەوە ئەم نامیلکە بنوسم؟**

ڕۆژێك لە ماڵێك بووم پرسیارێکم ئاڕاستەی منداڵی ئەم ماڵە کرد، پرسیم ڕۆڵە گیان! ئایا ئەرکانی ئیسلام چەندن؟ وتی: نازانم، وتم: ڤەیناکە ئەدی ئەرکانی ئیمان چەندن؟ وتی: نازانم، باوکی وتی: مامۆستا بە ڕاستی منیش نازانم، مسوڵمانان بە ڕاستی کارەساتە ئەندامانی خێزان بە گەورەو بچوکەوە بەم شێوە بێئاگابن لە دینی خوا لە شارو وڵاتی مسوڵمانان!

جا خوێنەری بەڕێز ئەم نامیلکەی بەر دەستت، چیرۆکێکی ڕاستە ڤینەیە، کە فەرموودەیەکی ڕاستی پێغەمبەرە ﷺ گفتو گۆو پرسیار و وەڵامە لە نێوان فریشتەی وەحی جبریلو پێغەمبەر ﷺ بە ئامادەبوونی ژمارەیەك لە هاوەڵە بەڕێزەکان کە لەم مەجلیسەدا دانیشتبوون، جا ئەم فەرموودەی باوکم بۆی گێڕامەوە بە (حدیث جبریل) بەناوبانگە، یان بە فەرموودەی پلەکانی ئایین. فەرموودەیەکی زۆر گرنگە، پێویستە هەموو

مسوڵمانێك به پیاوو ئافرەتو منداڵ بیزانێ، چونكه ئەركانی ئیسلامو ئەركانی ئیمانو چاكەو باسی ڕۆژی قیامەتی له خۆ گرتووە، بۆیه داواكارم هەموو مسوڵمانێك ئەم فەرموودە لەبەر بكاتو خێزانو منداڵەكانیشی فێر بكات، چونكه بەر پرسیارە بەرانبەریان له دنیاو دوارۆژ.

**قسەی هەندێ لە زانایان لەسەر ئەم فەرموودەیە:**

١/ ئیمامی نەوەوی، ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ: (وَاعلمْ أنَّ هَذَا الحَدِيثَ يَجْمَعُ أنْوَاعَاً مِنَ العِلْمِ وَالمَعارِفِ والأدابِ واللطَائِفِ، بَلْ هُوَ أصْلُ الإسْلامِ، وَفِيهِ أنَّ الإيمَانَ وَالإسَلامَ وَالإحْسَانَ تُسمَّى كُلُّهَا دِيْنَاً).

واتە: بزانە ئەم فەرموودە هەموو جۆرە زانستێکی تێدایە لە زانیاری‌و هەڵسوکەوت‌و دەقە وردەکان، بەڵکو بنچینەی ئیسلامە، لەم فەرموودە باوەڕو ئیسلام‌و چاکە ناونراوە ئایین.

٢/ ئیبنو ڕەجەبی حەنبەلی، ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: (وَهُوَ حَدِيثٌ عَظِيمٌ جِدَّاً يَشْمَلُ عَلى شَرْحِ الدِّينِ كُلِّهِ).

واتە: ئەم فەرموودە زۆر گرنگ‌و گەورە و پایە بەرزە، ئەتوانرێ هەموو ئایینی پێ شەرح بکرێ.

٣/ ئیمامی قورتوبی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (هَذَا الحَدِيثُ يُصلَحُ أن يُقَالَ لَهُ أمُّ السُّنةِ، لِمَا تَضَمَّنَهُ مِنْ جُمَلِ عِلْمِ السُّنةِ).

واته: گونجاوه بەم فەرمووده بگوترێ دایك و كۆكەرەوەی هـەموو فـەرموودەكان لەبـەر ئـەوەی زانسـتی هـەموو فەرموودەكانی تێدایه.

٤/ شێخ محمـد حسـان: پـەرتوكێكی دانـاوە لەسـەر ئـەم كتێبە داناوە كه حەوت بەرگه، لە (٣٧٤٣) لاپەڕە پێكهاتووه، دەڵـێ (حَـدَّثنِي أبـي)بـاوكم بـۆی گێرامـەوە بەرنامەیـەكی پەروەردەییه .

منیش : وەك خزمەت كاری زانایانی راستەقینه دەڵێم ئایا ئێمە مندالّی خۆمـان وا پـەروەردە كردیـە، بـەیانی كـه مردین بڵێن باوكمان ئەم فەرموودەی بـۆ گێرایـنـەوە ، یـان بەپێ رێنمایەكانی خوا و پێغەمبەر پـەروەردەمان كـردون، ئەگـەر وامـان نـەكردبێ لـە خـۆم را كەمتـەر خـەمین ، بـا هەموومان ئەوەی لە دەسـت چـووە قـەرەبووی بكەینـەوە ، چەندە خۆش و سەربەرزیە بۆ ئیمامی عومەر ، عەبدولای كوری دەڵێ باوكم ئەم فەرموودەی بۆ گێرامەوە .تاكو رۆژی قیامەت زانایان و فێرخوازان و قوتابخانـەكان و میحـراب و مینبەرەكان دەیڵێنەوه.

# دەقی فەرموودەکە

{حَدَّثَنِي أَبِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ إِذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَيَاضِ الثِّيَابِ شَدِيدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، لاَ يُرَى عَلَيْهِ أَثَرُ السَّفَرِ وَلاَ يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتَّى جَلَسَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ عَلَى فَخِذَيْهِ، وَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! أَخْبِرْنِي عَنِ الإِسْلاَمِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً»، قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَعَجِبْنَا لَهُ يَسْأَلُهُ وَيُصَدِّقُهُ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟ قَالَ: «أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»، قَالَ: صَدَقْتَ. قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ؟ قَالَ: «أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ». قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: «مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ»، قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَتِهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا، وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ الْعُرَاةَ الْعَالَةَ رِعَاءَ الشَّاءِ يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ»؟ قَالَ: ثُمَّ انْطَلَقَ فَلَبِثْتُ مَلِيّاً، ثُمَّ قَالَ لِي: «يَا

عُمَرُ! أَتَدْرِى مَنِ السَّائِلُ»؟ قُلتُ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ»}[1].

## لێكدانەوەی فەرموودەكە

عەبدوڵڵای كوڕی ئیمامی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ باوكم بۆی گێڕامەوە گوتی، جارێكیان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ناكاو پیاوێكمان هاتە بەرچاو جلو بەرگێكی زۆر سپی لەبەر بوو، مووی سەرو ڕیشی زۆر ڕەش بوو، هیچ شوێنەواری ڕێبواری لێ نەئەبینرا، وە هیچ یەك لە ئێمە نەیئەناسی، تا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشت هەردوو ئەژنۆی خۆی بە ئەژنۆی پێغەمبەر ﷺ نوساند، هەردوو دەستەكانی خۆی دانا سەر هەردوو ڕانەكانی خۆی (وەك قوتابی لە بەردەم مامۆستادا، ئەی موسوڵمان، تۆش ئەوا جلو بەرگت خاوێن بێو ڕوخسارت ڕێك و پێك بێو لەبەردەم زانایانی ئاینی بە

---

١) صحيح: أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٠٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٩٧)، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم: (٢٦١٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٩٩٠)، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٦٣) إِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ برقم: (٣٨٧١٣).

ئەدەب دانیشە، لە پرسیارکرن بە ئەدەبەو شەرم مەکە).
(قَالَ: يَا مُحَمَّدُ! أَخْبِرْنِـي عَنِ الإِسْلاَمِ؟) ئنجا ئەو پیاوە نەناسراوە، وتی: ئەی موحەممەد! هەواڵم پێبدە دەربارەی ئاینی ئیسلام؟ (ئنجا بزانە: بانگ کردنی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی خۆی، یان ناوهێنانی بە ناوی خۆی، دروست نیە ، تەنیا بۆ خوداو فریشتە نەبێ، بۆیی حەزرەتی جوبرائیل لێرەدا بە (محمد) بانگی کرد، بەڵام ئێمەی مسوڵمان دەبێ بە پێغەمبەراتی ناوی بێنین)، پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: «الإِسْلاَمُ أَنْ تَشْـهَدَ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللهِ، وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً»:

یەکەم: شت لە ئیسلامدا ئەوەیە: بە دڵ باوەرت هەبێت و بە زوبان بڵێی : جگە لە زاتی (الله) هیچ پەرستراوێك نیەو (محمد) نێردراوی خودایە، (ئەو پێغەمبەری هەردوو دنیایە، بزانە: پێویستە بۆ دروستبونی ئیسلامیەتی: وشەی (أَشْهَدُ) دووبارە بکرێتەوە و بگوترێ: (أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللهِ ). ئەبێ (أَنْ لاَ) بە (أَلاَّ) بخوینرێتەوە، هەروەها دروستە هەر کەسێك بە زمانی خۆی شادەو ئیمان بێنێ و مەرج نیە بە عەرەبی بێ، بەڵام پێویستە

له هەموو زمانێ وشەی شەهادە بەدوای یەکدا بێن، بەو جۆرەی نوسیومانە.

دووەم: شت لە ئیسلامدا ئەوەیە: (وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ،)هەر پێنج نویژەکان بە هەموو مەرجەکانەوە بکەی لە کاتی خۆیدا، ئەگەر کاتی خۆشی تێپەڕی دەبێ هەر بیکەی بە جۆریکی وا ئەگەر چەند ساڵ نوێژت نەکردبێ، ئەبێ بیگەڕێنیەوە و قەزایان بکەیتەوە.

جا بزانە: هەندێ لە زانایانی ئیسلام فەرموویانە: نوێژنەکەر کافرە، بەلاّم کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان ئەفەرموون: کافر نیە، بەڵکو فاسقە ئەگەر باوەری بە نوێژەکە هەبێ . لەگەڵ ئەوەشدا، هەردوو لا ئەفەرموون ئەبێ بکوژرێ .

سێیەم: شت لە ئیسلامدا: (وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ)ئەبێ زەکات بدەی، زەکات ئەوەیە: مسوڵمانی هەبوو نەختێك لە ماڵی خۆی ئەداتە مرۆڤی هەژارو نەدار، ساڵێ یەکجار، بە مەرجێك بگاتە رادەی زەکات، لە چل بەش یەك بەش زەکاتە، واتە: لە سەدا دوو و نیو، ماڵی بازرگانیش هەروایە، لە دانەوێڵە: لە چل تەنەکە بە تەنەکەی نەوت (٤) تەنەکە زەکاتە، لە ڕەشە

ولاخ له (٣٠) سەر، یەك گوێلكی نێری یەك ساڵە، وە له (٤٠) سەر یەك گوێلكی مێی دوو ساڵە، له مەڕو بزن له چل سەر، یەك بزنە، یان یەك مەڕە، له (١٢١) دوو له (٢٠١) ٣ له (٤٠٠) چوار .

هەروەها سەرفیترەی ڕەمەزان له جیاتی خۆت‌و هاوسەرو منداڵت، دوو کیلۆ دانەوێڵە، یان نرخەکەی ئەبێ بدەی بە هەژار، لەسەر فەرموودەی ئیمامی ئەبوو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

<u>چوارەم</u> شت له ئیسلامدا (وَتَصُومَ رَمَضَانَ،) بە ڕۆژووبونی مانگی ڕەمەزانە، ڕۆژوو له ئیسلامدا ئەوەیە؛ له بەرەبەیانەوە تا خۆر ئاوابوون خۆت قەدەغە بکەیت له خواردن‌و خواردنەوەو خۆ ڕشاندنەوەو دەستبازی کردن لەگەڵ ئافرەت‌و له شی خۆت، بەم جۆرە شتانە ڕۆژوو له دەست ئەچێت، بەڵام بە جنێو دان‌و گفتووگۆی پڕو پووچ‌و باسکردنی خەڵك له دەست ناچێ، بەڵکو خێرەکەی کەم دەبێتەوە.

<u>پێنجەم</u> شت له ئیسلامدا(وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً) حەج کردنە ئەگەر توانای چوون‌و گەڕانەوەت

هەبێ، واتە: ئەبێ خانوو خواردەمەنی بۆ منداڵو ژنەکەت دابین بکەی تا ئەگەڕێیتەوە، وە قەرزی خەڵکیش بدەیەوە.

حەج کردن لە ئیسلامدا ئەمەیە: لە تەمەن یەکجار بچیتە ماڵی خوا، لە مەککەی پیرۆز، لە وێ چەند جۆرە خوا پەرستیەك هەنە بیکەی، ئەبێ بەر لە چوونە حەج، تۆبە بکەی لە گوناهەکانت، ئەگەر ماڵی خەڵکت لەسەر بێ ئەبێ بیاندەیەوە، یان ڕازیان بکەی، لە دوای گەڕانەوەت دەست بە گوناه کردن نەکەیەوە..

ئەم پێنجانە پێیان ئەگوترێ: پێنج ڕوکنی ئیسلام، هەر کەسێك باوەڕی نەبێ بە واجببونی یەکێك لەم پێنجانە، کافر ئەبێ. دوای ئەم قسانە..

ئەم پیاوە نەناسراوە گوتیە پێغەمبەر ﷺ: ڕاست ئەکەی، ئیمامی عومەر فەرمووی: پێمان سەیر بوو، ئەو پیاوە پرسیاری لێ ئەکاتو پێشی ئەڵێ ڕاست ئەکەی! (قَالَ: فَأَخْبِرْنِي عَنِ الإِيمَانِ؟) دووبارە پیاوە نەناسراوەکە پرسیاری کردو گوتی: هەواڵم پێم بدە دەربارەی ئیمان، ئیمان چییە؟ (ئیمان بیرو باوەڕی ناو دڵە بەو شەش ڕوکنانەی پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا ژماردوونی، هەر کەسێك بە

یەکێك لەو شەشانە باوەڕی نەبێ ئەوە کافرە) پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: «أنْ تُؤْمِنَ باللَّهِ، وَمَلائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»:

رووکنی یەکەمی ئیمان: ئەوەیە بڕوات هەبێ (باللَّهِ) بە هەبوونی خوا ، کە هەر بووەو هەر دەمێنێ، زیندووەو نامرێ، هەموو شت دەزانێ، چ نهێنی چ ئاشکرا، دەبیستێ‌و دەبینێ، لە تاریك‌و ڕوناکی، توانای هەموو شتێکی هەیە بیکات. هەرچی بیەوێ دەیکات گفتوگۆی هەیە بێ پیت‌و دەنگ، لە هیچ شوێنێك نیشتەجێ نیە، هیچ شتێك وێنەی خودا نیەو خوداش وەك هیچ شتێك نیە، پێویستی بە هیچ شتێك نیە، هەموو شتێك ئەو دروستی کردووەو هەر ئەو دروستی ئەکات، ژیان‌و مردن‌و خۆشی‌و ناخۆشی‌و بوونی‌و هەژاری، هەمووی بە دەست ئەو خوایەیە.

ڕوکنی دووەمی ئیمان: ئەوەیە بڕوات هەبێ بە (مَلائِكَتِهِ)، واتە: بە هەبوونی فریشتەی خوا لە ئاسمان‌و لە زەمین.

پێناسە: ئەو فریشتانە چینێکن خوای گەورە لە ڕووناکی دروستی کردوون، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {«خُلِقَتِ

الْمَلائِكَـةُ مِـنْ نُـورٍ»}(أخْرَجَـهُ أحْمَد بـرقم: (٢٥٢٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٩٦))، وه ئەتوانن به هەموو شێوەیەك خۆیان بنوێنن، نه نێرن نه مێن، خەو و خواردنیان نیه، له فەرمانی خوا دەرناچن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۝٦﴾ ... ، لـەو فریشـتانه چواریان پلەی بەرزیان هەیه:

یەكـەم: (جِبْرائِیـل) وەحـی ئـەهێنێ بـۆ پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام).

دووەم: (مِیكائِیل) باران و ڕزق جێبەجێ ئەكات.

سێیەم: (مَلَك الْمَوْت) گیانی گیان لەبەر وەردەگرێ.

چوارەم: (إسْرَافِیل) چاوەڕوانی دنیا تێكدان ئەكات.

جگـه لەمانـه: فریشـتەی خـوا لـه بەهەشـتیش هـەن: گەورەكەیان ناوی (رضوان)ە هەروەها دوو فریشتەی تر به ناوی (منكر ونكير) پرسیار له مردوو ئەكەن، (كِرامٌ كاتبين) كردەوەی ئادەمیزاد ئەنوسن، نۆزده فریشتەی دی كارگێڕی جەهەننەمن پێیان ئەگوترێ: (زَبّانيَـةُ). گەورەكەیان نـاوی (مَالِك)ە، جگه لەمانەش، فریشته زۆرن هەر خودا به خۆی ئەزانێ ژمارەیان چەندە.

ڕوکنی سێیەمی ئیمان: ئەوەیە بڕوات هەبێ (بِكُتُبِهِ) بەو کتێبانەی بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هاتوون لە لای خوا، کە هەموویان فەرموودەی خودان، وەك صوحوفی حەزرەتی (ئیبراهیم) پێغەمبەر، تەوراتی (موسی) پێغەمبەر، زەبوری (داود) پێغەمبەر، ئینجیلی (عیسی) پێغەمبەر (عليهم الصلاة والسلام).

ئنجا قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەری ئاخیر زەمان حەزرەتی (مُحَمَّد الْمُصْطَفى) ﷺ هات، وە بە هاتنی قورئانی پیرۆز ئەوانی دی هەموو (نسخ) بوونەوە، بێ کار بوون، چونکە جگە لە قورئان هەموو دەستکارییان تێدا کراوە.

ڕوکنی چوارەمی ئیمان: ئەوەیە بڕوات هەبێ (بِرُسُلِهِ) بە هەموو پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام) کە ئەوانیش پیاون و ڕاستگۆ و ژیرو نەترسن، هەرچی خودا بفەرمووێ بە خەڵکی ڕائەگەیەنن، ژمارەیان (١٢٤٠٠٠) سەدو بیست وچوار هەزار پێغەمبەرە (عليهم الصلاة والسلام) هەروەك (إبن حبان) و (حاكم) لە (أبو ذر) گێڕاویانەتەوە.

پێناسە: پێغەمبەر پیاوێکە خوا ناردوویەتی بۆ ئەوەی بەرنامەی خوا بە ئادەمیزادان ڕابگەیەنێ، وە بە خۆیشی ڕەفتاری پێبکات، ئەمە پێی دەگوترێ: (رسُول) هەم (نَبی)، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێ نەکرابوو بە خەڵکی ڕابگەیەنێ، ئەمە تەنیا پێی ئەگوترێ: (نَبي)، ئنجا لەو هەمووانە (٣١٥) بە (رسُول) ناو ئەبرێن، واتە: نێردراو، چونکە کتێبی تایبەتییان لە لای خوا بۆ هاتووەو فەرمانی ڕاگەیاندنیان پێکراوە.

ئنجا لەوانەش پێنجیان بە (أُلُو العَزْم) ناو ئەبرێن: کە بریتین لە: (نوح) و (إبراهیم) و (موسی) و (عیسا) و (محمد) (علیهم الصلاة والسلام) سەرداری هەموویان حەزرەتی (مُحَمَّد المُصْطفی)یە ﷺ، ئەو پێغەمبەری ئاخیر زەمانە، هیچ پێغەمبەرێك لە دوای ئەو نایێ، بەڵام نابێ دەمارگیری بمانگرێ، ئەبێ بڕوامان بە هەمووانیان هەبێ: کە پێغەمبەری خودانە، تەنیا ئەوەندە هەیە بە یاسای ئیسلام، یاسای ئەوان لە کار کەوتووە، بەڵام ئەم شەش ڕوکنەی ئیمان هەموو پێغەمبەران وەك یەکدی بە ئۆممەتی خۆیان ڕاگەیاندووە، کەواتە: ئایینی هەموویان هەر یەکە، یاساییان جیایە.

ڕوكنی پێنجەمی ئیمان: ئەوەیە بڕوات هەبێ (وَالْيَوْمِ الآخِرِ) بە ڕۆژی دوایی، كە لە مردنەوە دەست پێ ئەكات، ئنجا لە دوای مردن، زیندوو ئەكرێینەوە، پاش ئەوەی ئەم دنیایە گشتی تێك ئەدرێ بە فوو لێ كردنی حەزرەتی (ئیسرافیل)، ئنجا جارێكی دیكەش فوو لە (صور) ئەكاتەوەو هەموو گیانلەبەرێك زیندوو ئەبنەوەو بەرەو گۆڕەپانی مەحشەر ئەكەونە ڕێ، ئنجا پرسیار و وەلأمان لێ ئەكرێ: دەربارەی كردەوەی دنیا، پاشان دەفتەری كردەوەكانمان "كە لە دنیا نوسراوە" دەماندرێتەوە، دوایی چاكەو خراپە بە تەرازوو ئەكێشرێ: ئەگەر چاكەت گرانتر بوو ئەوە ئەچیتە بەهەشت، ئەگەر خراپەت گرانتر بوو ئەچیتە جەهەننەم، ئنجا كە دادگای مەحشەر كۆتایی هات لەسەر جەهەننەم پردێك دائەندرێ: ئەبێ هەموو كەس بەسەری دا تێپەڕێ، مرۆڤی چاك ڕزگاری ئەبێ، بەلأم مرۆڤی خراپ لەوێ ئەكەوێتە خوارەوە بۆ ناو جەهەننەم، خوا بمانپارێزێ.

ڕوكنی شەشەمی ئیمان: ئەوەیە بڕوات هەبێ (بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ) بە قەزاو قەدەر: چاكە یان خراپە، ئەی مسوڵمان! هەرچی لەم دنیایە ڕوو ئەدا، لە هەبوونیو هەژارییو خۆشییو مردنو كوشتنو غەمناكیو هەموو بەسەر هاتێكی دی، هەمووی بە ویستو زانستی خوا

نووسراوەو کاتو شوێنو چەندایەتیو چۆنیەتی بۆ داندراوەو بەم جۆرە دێتە جێ.

بەڵام نابێ وا بزانین کە ئاوا نوسراوە بە زۆر ئەو ئیشەت پێئەکەن، بەڵکو خوا توانای چاکەو خراپەی داوەتە ئێمە، بە کەیفی خۆمان، ئەگەر توانایەکەمان لە چاکە بەکار بێنین، پاداشتت ئەدرێین، ئەگەر توانایەکەشمان لە خراپە بەکار بێنین سزا ئەدرێین.

ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ ئەو شەش ڕوکنانەی فەرموون، ئەویش فەرمووی: (صَدَقْتَ) واتە: ڕاست ئەکەی.

(قَالَ) دیسان پیاوەکە گوتی: (فَأَخْبَرْنِي عَنِ الإِحْسَانِ) پێم بڵێ: چاکە چیە؟ (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ) چاکە ئەوەیە: خوا بپەرستی (كَأَنَّكَ تَرَاهُ) وەك بە چاو ببیبینی لە کاتی پەرستنی دا، (فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ) جا ئەگەر نەتتوانی وەها بیپەرستی کە تۆ خوا ئەبینی (فَإِنَّهُ يَرَاكَ) وا بیپەرستە کە بێگومان خوا تۆ ئەبینێ.

مەبەست ئەوەیە: ئەوەندە بە ترسو بێگەردی خوا بپەرستە: وەك لەبەر چاوت بێ، یان تەماشات بکات.

بۆ نموونە:

کرێکارێك لەبەردەم خاوەنکارێك کار بکات، بێگومان کە خاوەنکارەکەی لەبەر چاو بێ باشتر کار ئەکات، هەروەها

ئەگەر لەبەر چاویشی نەبێ، بەڵام چاودێری بکات بە کامێرای چاودێری، دیسان ئیشەکەی هەر بە باشی ئەکات.

هەروەها: هەموو خاوەن باوەڕێك لە بەهەشتتدا بە چاوی خۆی خوای گەورە ئەبینێ، وەك خوای گەورە بۆ خۆی ئەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾القيامة، چەند ڕوخسارێك لە ڕۆژی قیامەت ئەدرەوشێنەوەو تەماشای خوای خۆیان ئەکەن. •

(قَالَ) دیسان پیاوەکە گوتی: (فَأَخْبِرْنِي عَنِ السَّاعَةِ) پێم بڵێ کەیێ دنیا وێران ئەبێ؟ (قَالَ)•پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ) ئەوەی پرسیاری لێ ئەکرێ زاناتر نیە لەوەی پرسیار ئەکات، چونکە پێنج شتی پەنهان‌و نەزاندراو هەنە تەنیا خوا بە خۆی ئەیانزانێ، هەروەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿٣٤﴾ ﴾لقمان، لەم ئایەتە پیرۆزەدا پێنج شتی پەنهان‌و نەزاندراو هەنە جگە لە خودای گەورە کەس نایانزانێ، یەکەم: کاتی دنیا وێران بوون، دووەم: کاتی هاتنی بارانی سوود بەخش، سێیەم: بەسەرهاتی کۆرپەی ناو منداڵدانە،

چوارەم: کەس نازانێ بەیانی چی ئەکات، پێنجەم: کەس نازانێ لە چ شوێنێك ئەمرێ.

(قَالَ) پیاوەکە گوتی: (فَأَخْبِرْنِي عَنْ أَمَارَاتِهَا) پێم بڵێ: نیشانەکانی دنیا وێرانبوون چین؟ (قَالَ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَهَا) یەك لە نیشانەکانی ئەوەیە: دایك ببێتە خزمەتکاری کیژەکەی خۆی، واتە: ئەوەندە بێ ڕێزی بلاّو ئەبێتەوە: کچ جوێن بە دایکی ئەداو فەرمانی بەسەردا ئەکا و خزمەتی خۆی پێئەکات.

(وَأَنْ تَرَى الْحُفَاةَ ) نیشانەیەکی دی ئەوەیە: دەبینی پێ خواسەکانو (الْعُرَاةَ)بێ بەرگەکان و(الْعَالَةَ) هەژارەکانو (رِعَاءَ الشَّاءِ) شوانەکان (يَتَطَاوَلُونَ فِي الْبُنْيَانِ) هەموویان شانازی لەسەر یەکتر ئەکەن بە بەرزیو جوانی کۆشكو تەلارەکانیان.

مەبەست ئەوەیە: ناکەس بەچەو لێنەهاتوەکان کارو باری خەڵکی ئەگرنە دەستو پیاو ماقوڵان ئەکەونە ژێر دەستی ئەوان.

جا ئەوانە تەنها دوو نیشانەی دنیا وێران بوونن، بەڵام نیشانەی دیکەش هەن، بە تایبەتی هی گەورە: وەك هاتنی دەجال، هاتنە خوارەوەی عیسی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێ)•گەڕانەوەی ڕۆژ لە لای ڕۆژ ئاواوە ... هتد.

(ثُمَّ انْطَلَقَ) ئنجا پیاوەکە ڕۆیشت (فَلَبِثْتُ مَلِيّاً) ئیمامی (عمر) فەرمووی: جا ماوەی سێ شەو مامەوە، پاش ڕۆیشتنی پیاوەکە (ثُمَّ قَالَ لِي يَا عُمَرُ) ئنجا چومەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی عومەر (أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟) ئایا ئەزانی ئەوە کێ بوو پرسیاری لێ کردم؟ (قُلْتُ) منیش گوتم (اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ) خواو پێغەمبەری خوا ﷺ زاناترن‌و ئەزانن، من نازانم (قَالَ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ) ئەوە (جبریل)بوو، کە فریشتەیەکی خوایە، (أَتَاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ) هاتبووە لاتان فێری ئاینی پیرۆزی ئیسلامتان بکات، هەتا بزانن چۆن پرسیاری ئاینی بکەن.

## چەند پرسیارو وەڵامێکی گرنگ لەم فەرمووده

پ[1]/ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کێیە؟

وەڵام: عەبدوڵڵا کوڕی عومەری کوڕی خەتتابە، بە منداڵی موسڵمان بووە، لە کاتی قورئان خوێندن زۆر دەگریا، کە ناوی پێغەمبەر دهێنرا دەگریا، لە خوا ترس و موجاجید بوو ، لە هاوەڵە گەورەکانە، زۆر شارەزا بووە لە ئایین، یەکێکە لە چوار (عبدالله)یە زاناکە، کە پێیان دەگوترێ (العبادلة الأربعة) کە ئەمانەش بریتیبوون لە :

١. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

٢. عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس.

٣. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر.

٤. عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص.

پ[2]/ عومەری کوڕی خەتتاب کێیە؟

وەڵام: عومەر کوڕی خەتتابە، دووەم خەلیفەی پێغەمبەر بووە ﷺ، دوای ئەبو بەکر، لە شاری مککە لە دایك بووە، (١٣) ساڵ پێش ڕووداوی ساڵی فیل، نازناوی (فاروق) ە، لەو دە کەسە بوو کە خوای گەورە لە دنیادا موژدەی بەهەشتی پێدابوون، ماوەی خەلافەتی (١٠) ساڵ و (٦) مانگ و (٤) ڕۆژ

بـووە، لـە تەمـەنی ( ٦٣) سـاڵی دا لـە نوێـژدا بـەیانی دوای تەکبیرەو خوێندنی زیکری دەستپێکردنی نوێژ شەهید کرا، بـە دەسـتی کـافرێکی ئـاگر پەرست کـە نـاوی (أبُـو لؤْلـؤَة المَجُوسِيُّ)، ئیبنـو عـەبباس دەڵێ: دوای ئـەوەی زانـی بـە دەسـتی ئـەو کـافرە لێـی دراوە، دەمو چـاوەی گەشـایەوەو فەرمووی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لمْ يَبْتَلِنِي بِقَوْلِ أحَدٍ يُحَاجُنِي بِقوْلِ: لا إلـهَ إلا اللّهُ). واتە سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە کەسێك تاقی نەکردمەوە وتبـێتی (لا إلـهَ إلا اللّـهُ) ببێتـە بەڵگە بەسەرمەوە .

پ[٣]/ خەلیفەکانی پێغەمبـەر ﷺ چـەندن؟ وە ناویـان چییە؟

وەڵام: چوارن: ئـەمانیش: ١- ئـەبو بـەکر، ٢- عومـەر ٣- عوسمان ٤- عەلی.

پ[٤]/ بنەماکان (ارکان)ەکان ئیسلام چەندن؟

وەڵام: بنچینەکانی ئیسلام پێنجن بریتین لە :-

١- شەهادە،

٢- نوێژکردن،

٣- زەکات،

٤- ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان،

٥- حەجی ماڵی خوا، ئەگەر لە توانا دا هەبوو.

پ[٥]/ بنچینەکان (ارکان)ی ئیمان چەندن؟

وەڵام: بنچینەکانی ئیمان شەشن کە بریتین لە:-

١- بڕوا بە خوا

٢- بڕوا بە فریشتەکانی خوا

٣- بڕوا بە پەرتووکە نێردراوەکانی خوا

٤- بڕوا بە پێغەمبەرانی خوا

٥- بڕوا بە ڕۆژی دوایی

٦- بڕوا بە قەزاو قەدەر

پ[٦]/ چاکە (الإحسان) چییە؟

وەڵام: چاکە ئەوەیە کە بزانی بە بێگومان لە هەموو کاتو شوێنێك خوا ئاگای لێتەو دەتبینێو دەبیستێو چاودێرە بەسەرتەوە.

پ[٧]/ جبریل کێیە؟

وەڵام: فریشتەیەکی خوایە، تایبەتە بە هێنانی وەحی بۆ پێغەمبەران.

پ[8]/ بۆچی خوای گەورە جبریلی نارد کە ئەم پرسیارانە ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ بکات؟

وەڵام: بۆ ئەوەی کە صەحابەکان فێری دین بکات، دواتریش ئێمە فێربین و منداڵەکانمان فێر بکەین.

پ[9]/ خوای گەورە چەند پێغەمبەری بۆ مرۆڤایەتی ناردووە؟

وەڵام: خوای گەورە (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەری ناردووە.

پ[10]/ کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد چەند صەحابەی لە ژن و لە پیاو لە دوا جێما؟

وەڵام: (١٢٤٠٠٠) صەحابە بوون خوا لە هەموویان ڕازی بێ

پ[11]/ ئایا دایك و باوك بەرپرسیارن بەرانبەر کوڕ و کچەکانیان؟

وەڵام: بەڵێ زۆر بەرپرسیارن بەرانبەر خوا، ئەبێ پەروەردە بکرێت لە ڕووی لاشەو ڕووح و عەقڵ، لە هەموویان گرنگتر لایەنی ڕووحییە کە پەیوەندی بە عەقیدەو پەروەردەی ئیسلامی هەیە، کە لە دنیا لای خەڵك سەربەرزەو

ڕۆژی دوایش لە لای خوا سەر فرازە، ئەگەر جوانی پەروەردە کردبوو.

خوای گەورە لە بارەی بەرپرسیاریەت دەربارەی ماڵ و منداڵ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ ﴾ ...، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خۆتان و ژن و منداڵتان لە ئاگرێك بپارێزن كە سوتەمەنیەكەی خەڵك و بەردە، كۆمەڵە فریشتەیەكی زبرو توندو تیژ بەسەریەوەن، هەرچەندە داوای بەزەییان لێ بكرێ كەڵكی نیە، بێ فەرمانی خوا ناكەن، لە هەر شتێك فەرمانیان پێ بكات، وە هەر كارێكیشیان پێ بسپێرێ بە خێرایی ئەنجامی دەدەن.

بەڵێ: بەرپرسیاریەتی بەرانبەر بە خزم و كەس و ماڵ و منداڵ و ژن، بنەمایەكی گرنگە لە ئیسلامدا، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرموویەتی: {كُلُّكُمْ رَاعٍ فَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ وَهِيَ مَسْئُولَةٌ

عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْـهُ، أَلاَ فَكُلُّكمْ رَاعٍ وَكُلُّكمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِـهِ} (أَخْرَجَـهُ الْبُخَـارِيُّ برقم: (٦٧١٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٨٢٨))، كەواتـە: هـەر كەسێك بەرانبـەر ئـەوەی خـوار خـۆی بەرپرسـە، جـا لـە شوانێكەوە تا ئەمیرو سـەركارێك، دەبێ هـەر یەكـەمان بـە ئەندەزەی دەستەڵاتی خۆی ئەركی سەر شانی خۆی ئـەنجام بدات.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ مَوْلُـودٍ إِلاَّ يُولَـدُ عَلَـى الْفِطْـرَةِ، فَـأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِــهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَـةُ بَهِيمَـةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَـا مِنْ جَدْعَاءَ}(أَخْرَجَـهُ الْبُخَـارِيُّ بـرقم: (١٢٩٢)، وَمُسْـلِمٌ بـرقم: (٢٦٥٨)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٧١٤)، وَأَحْمَد برقم: (٧١٨١) قالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صحيح على شَرْط الشَّيْخَين)، واتە:

واتە: هەموو منداڵێك بە پاكیو لەسەر فیترەت لە دایـك دەبێ، بەڵام دوایی دایكو باوكی دەیكەنە جوولەكە، یان گاور، یان ئـاگر پەرست، وەك چۆن ئـاژەڵ بێچووەكەی بـە سـاغو سـەلامەتی دەبـێ، ئایـا هـیچ نـەنگیو عـەیبێكی لـێ بـەدی دەكرێ؟

ئەبو حامدی غەزالی دەڵێ: (منداڵ ئەمانەتە لای دایك و باوك، دڵی گەوهەرێكی پاكە، هیچ نەخش و وێنەی تێدا نیە، ئامادە سازە بۆ هەموو نەخشێك، ئەگەر ڕاهێنرا لەسەر چاكەو فێر كرا بەم شێوە گەشە دەكات، دایك و باوكی لە دنیاو قیامەت پێی سەربەرزن و لە چاكەی منداڵ بەشدارن.

بەڵام ئەگەر لەسەر شەڕ و خراپە ڕاهێنرا، و وەك ئاژەڵ پشت گوێ خرا، نا لەبار و تیاچوو و دۆڕاوە، گوناهو تاوانەكانیشی لە ئەستۆی دایك و باوكیەتی.

پ١٢/ئایا منداڵ لە چەند ساڵی نوێژ و ڕۆژووی لەسەرە ؟

وەڵام ،منداڵ تەكالیفی شەرعی لەسەر نیە وەك پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ (رُفِعَ قلمُ عَنِ الثلاثةِ: عَنْ النائم حتى يَستيقظَ و عن الصَغيرِ حتى يَكْبُرَ و عن المجنونِ حتى يَفيقَ ) رواه ابن ماجه . واتە سێ كەس گوناهیان لەسەر نیە خەوتوو تا بەخەبەر دێ منداڵ تا گەورە دەبێ شێت تا چاك دەبێتەوە .

بەڵام ئەبێ دایك و باوك وەك ڕاهێنان و فێر كردن منداڵەكانیان بە ڕۆژوو بكەن ئەگەر لە توانایاندا بوو , وەك پێغەمبەر

(ﷺ)دەفەرمووێت (مُرُوا أبناءكُمْ بِصلاةِ وَهُمْ أبناءُ سَبْعٍ واضربُهُمْ عليها وَهُمْ أبناءُ عَشْرٍ وَفرِّقوا بَينَهُمْ في المضاجع) رواه احمد

واتە : فەرمان بەمنداڵەکانتان بکەن بە نوێژ لە (٧) ساڵی وەلە (١٠) ساڵی لەسەر نوێژنەکردن لێیان بدەن و جێگەیان لەگەڵ یەکتر جیا بکەنەوە .(بێگومان ئەم لێدان و جێجیا کردنەوە بۆ بەرژەوەندی منداڵە لە دنیا و دوارۆژ) وە گومان لەوەدا نیە رۆژوو گرانترە لە نوێژ بۆیە ئەبێ بە پلە پلە بێ , منـدال لـە ٨ و ٩ و ١٠ سـالی دەتـوانێ بـە رۆژوو بێ و دایك و باوکی چاکتر دەزانن لە چەند ساڵی تواناى هەیە , صەحابەکان منداڵی خۆیان بە رۆژوو دەکرد و مەشغولیان دەکردن بە یاری , ئەبێ ئێمەش چاو لە ئەسحاب بکەین

## پ١٣/ ئیمام (مسلم) کێیە ؟

وەڵام ، نـاوی موسـلیمی کـوری ئەلحـەججاجی کـوری موسلیمی کوری کەرشان ئەلقوشیری لـە ئەننەیسابوری لـە هوزی بەنی قوشیرە ، دوای ساڵی (٢٠٠) ی کۆچـی لـە دایـك بووە، نزیکە( ٦٠) سـاڵ ژیـاوە، خـاوەن چـەندین پـەرتووکی چـاپکراوە لەوانـە صـەحیحی مسـلم کـە نزیکـەی (٤٠٠٠) فەرموودەی تیایە، ئیمام مسلم مەشهورە بە حافزی گەورەو

حوججەتی ئیسلام ،حافز بەکەسێك ئەوترێ لای کەم (١٠٠٠٠) فەرموودەی لەبەر بێ بە سەنەد و دەقەوە(درایە و روایە) ،

دوا وتە: منداڵەکەت لە (٥) شت بپارێزەو لە (٥) شت نزیکی کەوە قازانج دەکەی و سەربەرزدەبی:

| بیپارێزە لە: | نزیکی بکەوە لە: |
|---|---|
| ١. گۆرانی حەرام | قورئان خویندن |
| ٢. برادەری خراپ | برادەری باش |
| ٣. خزمی خراپ | خزمی باش |
| ٤. لە بەرنامەی خراپ | لە بەرنامەی خوا |
| ٥. جگەرکێشان | سیواك کردن |

الحمد لله اولا و اخیراً

هەولێر- کوردستان
٢٠١٥/٤/١٤
خدر حمد خە تی
پێشنوێژ لە مزگەوتی عوزێری لە هەولێر
بەهیوای دوعای خێر بۆ من و دایك و باوکم

## سەرچاوەکان:


١- تەفسیری رامان، م. احمد کاکە محمود.

٢- جبریل یسأل والنبی ﷺ یجیب، محمد حسان.

٣- رونکردنەوەی چل حەدیسی پێغەمبەر ﷺ، م. عبدالله هەرتەلی.

٤- ئەصحابەو خەلیفەکانی راشیدین بناسە، م. قاسم محمد.

٥- التربیة الاسلامیة وأثرها في السلوك الانساني، م. هاشم کریم خۆشناو.

٦- پیاوان و ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر ﷺ، وەرگێرانی: تارا حمە سعید.

٧- شەش پێشەوایەکی فەرموده ٠ نجم الدين فرج احمد

٨- یسألونك . حسام الدين موسى عفانه



سوپاس وپێزانین

باوکی (کەیوان) هاوکاربوو بۆ بەنجام گەیاندنی ئەم نامیلکە خوا پاداشتی بداتەوە

زۆر سوپاس بۆ کاك سیروان و کاك احمدی کورم لە تایپ وکۆمپیوتەر یارمەتیان دام خوا پاداشیان بداتەوە

# ناوەڕۆك